کوڕی بۆ فەقێیەتی ، دڵی لە نۆدشە هەڵئەکەنرێ‌و ئەچێ بۆ سنە • میرەکانی ئەردەڵان لای خۆیان ئەیکەن بە مودەڕریس • پاش ئیجازە وەرگرتنی مەلا ئەحمەدی کوڕی لە سنەیش نامێنێ‌و دێ بۆ سولەیمانی‌و لە مزگەوتی (مەلکەندی) ئەبێ بە مامۆستاو پێش‌نوێژ • پاشان ئەشکرێ بە موفتیی سولەیمانی‌و تا کۆچی دوایی کردووە لە ١٢٦٤دا ، هەر موفتی بووە • قەبری حاجی مەلا عەبدولڕەحمان لە گردی سەیوانە •

ئەم دیاری‌کردنی ساڵی وەفاتی مەلا عەبدولڕەحمانە لەسەر ئەوەیە کە شێخ موحەممەدی سمێرانی لە (بارقات)دا نووسیویە ئەڵێ حاجی مەلا عەبدولڕەحمان لەسەردەمی موتەسەڕیفی‌یەتیی موحەممەد مونیب پاشادا بووە کە ئەویش پاش تەواوبوونی چەرخی بابانەکان هاتووە کە ڕێکەوتی ئەو ساڵە ئەکا •

هەروەها شێخ موحەممەدی سمێرانی ئەڵێ حاجی مەلا ئەحمەد پاش وەفاتی باوکی بەیارمەتیی موحەممەد مونیب پاشا ئەکرێ بە موفتی لەجێی باوکی‌و پاش ئەو موحەممەد مونیب پاشا نەقڵ‌ئەکرێ بۆ مووسڵ‌و موصطەفا پاشا ناوێك دێتە جێی • ئەم موصطەفا پاشایەش ئینسانێکی سالم‌و باش بووەو زۆر حورمەتی حاجی مەلا ئەحمەدی گرتووەو دەرزی صەحیحی بوخاریی لە خزمەتیدا خوێندووە • بە عادەتی هەمیشە پاش ماوەیەك هەندێ کەس دەستیان‌کردووە بە مونافەسەی حاجی مەلا ئەحمەدو بەم مەبەستە هاتوچۆیەکی زۆری لای موصطەفا پاشایان کردووەو عەرزوحالیان داوە بۆ داوای عەزڵ‌کردنی حاجی مەلا ئەحمەد تا فەرمانی عەزلی لە ئەستەموولەوە دێ ، بەڵام موصطەفا پاشا لەبەر ڕەوشت‌بەرزیی خۆی ڕووی‌نایەت فەرمانەکە پیشانی حاجی مەلا ئەحمەد بدا ، پێی‌ئەڵێ بڕۆ بۆ بەغدا بەڵکو بەهۆی موفتیی زەهاوی‌یەوە فەرمانی موفتی‌یەتی‌یەکەت بۆ دووبارە بێنێتەوە • حاجی مەلا ئەحمەدیش ئەچێ بۆ بەغداو بە میوانی لای موفتی دائەبەزێ • موفتی

هەوڵێکی زۆری بۆ ئەدا تا دووبارە ئەمری موفتیی‌ەتیی بۆ دەرئەچێتەوە ، بەڵام حاجی مەلا ئەحمەد بەهۆی هەندێ حاڵەتی نەفسیی خۆیەوە پەشیمان ئەبێتەوەو ناچێتەوە سەر وەزیفەکە .

بیستوومە هەر لەورۆژەدا کە ئەمری دانانەوەی حاجی مەلا ئەحمەد گەیشتووەتە دەستی موفتیی زەهاوی ، حاجی مەلا ئەحمەد بە خزمەتی موفتی ئەگاو موفتی‌یش مژدەی بە موفتی کرانەوەکەی پێ ئەگەیەنێ . حاجی مەلا ئەحمەدیش پاش سوپاسی زۆرو بەیانی مەمنوونی‌یەتی لە موفتی عەرزی‌ئەکا کەوا بڕیاری‌داوە ئیتر موفتی‌یەتی نەکا . موفتی زەهاوی لەمە زۆر دڵگران ئەبێ‌و بە حاجی مەلا ئەحمەد ئەڵێ بەهۆی ئەم مەسەلەیەوە گەلێ لە پیاوماقوولانی سولەیمانی لێم دڵگران بوون ، کەچی وا ئێستە تۆیش وەزیفەکەت ناوێ ، بەڵام حاجی مەلا ئەحمەد لە بڕیاری خۆی پاشگەزنابێتەوەو ئەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی‌و لە سولەیمانی‌یش بارئەکاو ئەچێتەوە بۆ تۆدشەی هەورامان‌و لەوێ دەست‌ئەکاتەوە بە دەرزوتنەوەی فەقێ‌و پێش‌نوێژی کردنی موسوڵمانان. بەپێی هەندێ بەڵگە ئەبێ ئەم ڕووداوانە لە ١٢٦٨ی هیجرەتدا ڕوویان‌دابێ .

لەگەڵ ئەوەشدا کە حاجی مەلا ئەحمەد بەهۆی پایەی بەرزی مەلایەتیی خۆی‌و بە یارمەتیی موحەممەد مونیب پاشا ، پاش کۆچی دوایی باوکی بووە بە موفتیی سولەیمانی‌و پاش موحەممەد مونیب پاشا موصطەفا پاشایش زۆر قەدرو حورمەتی گرتووە ، بەهۆی کرداری بەدی هەندێ کەسەوە گەلێ جار تووشی دڵگرانی بووە چونکە ئەوانە ویستوویانە بیشکێنن‌و بەدناوی بکەن . بیستوومە ڕۆژێ لە مەجلیسێکی گەورەدا مەلایێ شوێنێکی لە (ابن‌حجر) نیشان‌داوەو داوای لێ کردووە مەعنای لێ‌بداتەوە ، بەڵام ئەو شوێنە لەو نوسخەیەدا هەڵەیەکی تیا بووە ، حاجی مەلا ئەحمەدیش پاش تەماشاکردنی شوێنەکە بە خەتی خۆی ڕستەیەك ئەنووسێ‌و ئەڵێ ئەم شوێنە

به بێ ئەم زیادەی منە مەعنای نایەت ، کە پاشان نوسخەی بێهەڵەی (ابن‌حجر) دێنن ، تەماشائەکەن هەمان زیادەی تیایە کە حاجی مەلا ئەحمەد نووسیبووی تەنها حەرفێکی (و) نەبێ • ئەمە لەناو خەڵکدا دەنگ‌ئەداتەوەو ئەبێ بەهۆی بەرزتربوونەوەی پایەی حاجی مەلا ئەحمەد لە کۆمەڵدا ، بــەڵام ناحەزان‌و بەدکاران بەوەش داناکەون‌و دەس لە بەدکاریی خۆیان هەڵناگرن •

هەر لەو سەردەمەدا کە حاجی مەلا ئەحمەد موفتیی سولەیمانی بــووە گەلێ‌جار مەلایانی سولەیمانی بەربەرەکانێیان کردووە ، وەك ئەوە کــە لە مەسئەلەی شەرطی تەعلیقی‌و ئیلزامیدا ڕوویداوە ، کاتێ کە موفتی فتوای بە کەوتنی تەڵاقی کابرایەك داوەو ، مەلاکانی‌تر هەریەکە لەئاستی خۆیــەوە نووسینێکی دوورو درێژی لەسەر نەکەوتنی ئەو تەڵاقە نووسیوە ، حاجــی مەلا ئەحمەدیش بەپێی پێویستیی وەزیفەکەی خۆی کە موفتی‌یەتی بووەو ، بۆ ئیسپات‌کردنی ڕاستیی فتواکەی نووسینێکی لە بەرپەرچدانەوەی ئەواندا نووسیوە• هەموو ئەو نووسینانەم لە بەرگی سێهەمی (جواهر الفتاوی)کەمدا لەچاپ‌داوە • هەرکەسێ ئەندازەیەك مەلایەتیی هەبێ‌و بێ‌ئینساف نەبێ ئەزانێ فتواکەی حاجی مەلا ئەحمەد ڕاستەو ئەوانی‌تر لە ڕێگەی ڕاست لایان‌داوە •

حاجی مەلا ئەحمەدی تۆدشی هەلێکی لەباری بۆ هەڵکەوتووە بــۆ خوێندن • لە خزمەتی باوکی‌و لە خزمەتی مەلا گەورەکانی ئەو ســەردەمەی کوردستانی خواروودا خوێندوویەتی • لە عولوومی عەقلی‌و نەقلیدا سەرامەد بووە • لە ڕیازیاتدا دەستێکی باڵای بووە • ئیجازەی مەلایەتیی لای زانای گەورەی کوردستان مەلا موحەممەدی خەتێ وەرگرتووە • کە گەڕاویشەتەوە بۆ سولەیمانی تەدریسێکی باشی کردووەو فەقێی بەقابیلەت‌و تێگەیشتووی بووە • یەکێ لەوانە مەلا عەبدولڕەحمانی مەشهوور بە مەلای پێنجوێنی بووە کە هەر بە حاجی مامۆستا ناوی‌بردووە • هەروەها مەلا قادری کانی‌کەوەیی‌یش

که به مەلای گەورەو مەلای بیارە بەناووبانگ بووە ، لای ئـەم ئیجـازەی وەرگرتـووە •

لە دەوروبەری ١٢٩٠ی هیجرەتدا مەلا عەلیی قزلجی کـە مەلایەکـی بەناووبانگ بووەو لە تورجان مودەڕریس بووە ، بە سەفـەر هاتـووە بـۆ هەورامانو لە خانەقای تەوێلە لەگەڵ حاجی مەلا ئەحمەد ئەکەونـە گفتوگۆ لەبارەی وشەی (تەلاقم)ەوە کە لەناو کوردانا باوە ، ئاخۆ صەریحـە بـۆ تەلاقدانی ژنو تەلاقی پێ ئەکەوێ ، یا کینایەیەو ئەبێ نیازی تەلاقی لەگەڵدا بێ ئەگینا تەلاقی پێ ناکەوێ ؟ مەلا عەلی لای وابووە کینایەیەو حاجی مەلا ئەحمەد بە صەریحی داناوە • پاش گفتوگۆیەکی زۆر مەلا عەلی هاتووەتە سەر ڕاکەی حاجی مەلا ئەحمەدو جاڕیداوە کەوا لە ڕاکەی خۆی پەشیمانـە • مەلا عەلی کە ئەگەڕێتەوە بۆ موکریان ، بە مەریوانا گەڕاوەتـەوە • لە ڕێ لائەداتە لای حاجی سەیید حەسەنی چۆڕی کە ئیجازەی لەسەر دەستی مەلا عەلیدا وەرگرتووە ، لەگەڵ ئەویش ئەکەوێتە گفتوگۆ لەوبارەیەوەو پێی‌ئەڵێ کەوا لە ڕاکەی خۆی پەشیمان بووەتەوەو چووەتە سەر ڕاکەی حاجی مەلا ئەحمەد • حاجی سەیید حەسەن پێی‌ئەڵێ : قوربان ! ئێمە چەند ساڵە لەسەر ڕاکەی تۆینو بەوە فتوا ئەدەین ، ئێستە تۆ چۆن بە سەعاتێ لە ڕاکەی خۆت پاشگەز بووینەوەو چوویتە سەر ڕای حاجی مەلا ئەحمەد ؟ مەلا عەلی‌یـش وەلامی ئەداتەوە ئەڵێ : حاجی سەیید حەسـەن ئینصـاف زۆر خۆشـە • باوەڕبکە کە حاجی مەلا ئەحمەد کەوتە تەقریری مەعنای عیبارەتی ئیبنوحەجەر، وای لێك‌ئەدایەوە کە ئیبنوحەجەر خۆیشی هەر وای ئەزانی •

جارێکیان لەبارەی پایەی مەلایەتیی حاجی مەلا ئەحمەدەوە لە مەولەوی ئەپرسن ، ئەویش ئەڵێ : بەڕاستی پایەی عیلمیی حاجی مەلا ئەحمەد بۆ من دیاری ناکرێ ، بەلام ئەوەندە ئەزانم لە سەردەمی خۆیـدا تاقـانە بـوو : جارێکیان حاجی مەلا ئەحمەد لە سنە بوو ، منیـش لە خزمـەتیا بـووم ،

ئاخوونێکی زۆر گەورەو بەناووبانگی ئێرانی هاتبوو بۆ سنە ، بەوبۆنەیەوە گەلێ لە ئەعیانی شارو زانایانی وڵات کۆبوونەوە ، ئاخوونیش هات ، ئێمەیش لەو کۆبوونەوەدا بەشدار بووین ، لە کۆبوونەوەکەدا مەسەلەیەك هاتە پێشەوە ، ئاخوونو حاجی مەلا ئەحمەد کەوتنە قسە ، تاماوەیەك قسەی هەردوولا بەجۆرێ بوو هەموو مەلا بەشدارەکان لێی حاڵی ئەبوون ، پاش ئەوە وا بەرزبووەوە تێ گەیشتم ئەهلی مەجلیس هیچی لێ تێ ناگەنو تەنها حاجی مەلاو ئاخوون لەیەك ئەگەن ، پاش ماوەیەکی تر وای لێ هات زانیم ئاخوونیش سەرسام بووەو هەر (بەڵێ) کردنی بۆ ماوەتەوە ، سەرەنجام بەتەواوی کپو بێ دەنگ بوو .

ئەگێڕنەوە لە ساڵی ١٢٩٠ی هیجرەتدا حاجی مەلا ئەحمەد لەگەڵ شێخ موحەممەد بەهائوددین ئەچێ بۆ حەج ، کە ئەگەنە بەغدا بە میوانی لای موفتیی زەهاوی دائەبەزن ، پاش نانخواردنی شەو مەلای نۆدشەیی شوێنێکی حاشیەی عەبدولحەکیم لەسەر شەرحەشەمسی لە موفتی ئەپرسێ ، موفتیش وەڵامی ئەداتەوە ، مەلای نۆدشەیی ڕەخنە لە وەڵامەکەی موفتی ئەگرێ ، دیسانەوە موفتی وەڵامی ئەداتەوەو ئیتر هەر بەمچەشنە ڕەخنەو وەڵام درێژە ئەکێشێ تا خزمەتکارەکەی موفتی دێ ئەڵێ : «مولانا ! طلع الصباح » ، واتە بەوباسەوە شەو ڕۆژئەکەنەوە ، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە هەردوولا چەند خوێندەوارو ورد بوونو چۆن عیبارەتی حاشیەکەیان لێکداوەتەوەو قسەیان لەسەر کردووە ، ئەگینا گفتوگۆ لەبارەی باسێکی واوە ئەوەندەی پێ ناوێ شەوی پێ ڕۆژ بکرێتەوە .

ئەگێڕنەوە هەر لەو سەفەری حەجەدا ئەیشچنە میسر ، لەوێ مەلایەك گەلێ پرسیارو ڕەخنە ئامادە ئەکا لە حاجی مەلا ئەحمەدی بگرێ ، کە ئەکەونە قسەوە ماوەیەکی زۆر قسە ئەکەن ، لەئەنجاما مەلاکە عەرزی حاجی مەلا ئەحمەد ئەکا : قوربان ! بە شێوەی بەڵگە هێنانەوە ، بەڵگەم نەماوەو

قەناعەتم بە قسەکانتان کردووە ، بەڵام هێشتا دڵم ئاوی نەخـواردوەتەوەو هەروەکوو ئەوسا وام • جا حاجی مەلا ئەحمەد عەرزی شـێخ موحەممـەد بەهائوددین ئەکا ئەڵێ : قوربان ! ئیتر لەمەولا مەیدانی تەئثیری ڕۆحانییەو من لەو مەیدانەدا دەستم ناڕوا • تۆ پێت ئەکرێ چارێکی ئەم داماوە بـکە زۆر خـێرە •

لە کورتی بیبڕینەوە حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی یەکێك بووە لـە مەلا هەڵکەوتووەکانی سەردەمی خۆی • ئەم ذاتە گەلێ فتوای بەقیمـەتی نووسیوە ، من هەندێکیانم دەسگیر بووەو لـە بەرگی سێهـەمی (جواهر الفتـاوی)کەمدا نووسیومنەتـەوەو بڵاوم کردوونەتـەوە • هەندێـکیشانم بەداخەوە دەستگیر نەبوو • حاشیەی لەسەر کیتابی نیکاح و صیداق و خولع و تەڵاقی توحفەی ئیبنوحەجەر هەیە دەستم نەکەوتـوون • ئـەو نوسـخەی ئیبنوحەجەرە کە ئەو حاشیانەی لەسەر نووسراوەتەوە ، لای نەوەکانی هەیە ، ئەگەر کەسێ بۆی هەڵکەوێ بیبان نووسێتەوەو لەچاپیان بدا خزمەتێـکی گەورە بە فیقهی ئیسلامی ئەکا [٢] •

---

(٢) مەلاکانی کوردستان دەستێکی باڵایان لە حاشیەلێکردن و لێکۆڵینەوەی توحفەی ئیبنوحەجەردا بـووە ، بەڵام بەهـۆی نەبوونـی چاپـەوە لەو سەردەمەدا لە کوردستان و بەهۆی گوێنەدانی خوێندەوارانی ئەمڕۆوە بەمجۆرە بابەتانە ، بەرهەمی ئەو مەلایانە بەدەگمـەن دەسـت ئەکەون و لەوانەشە بفەوتێن ، لەگەڵ ئەوەشا کە بڵاوکردنـەوەی ئـەو حـاشیانە بەشداری یەکی گەورەیە لە ژیاندنەوەی بەشداریی مەلایانی کوردستانـدا بۆ پەرەپێدانی فیقهی ئیسلامی •

بۆنموونە بیستوومە یوسفی ئەصەم کە مەلایەکی گەورەی ناوچـەی باڵەك بووە مودەووەنەیەکی لەسەر توحفە هەیە تا باسی ڕەهن گەیشتووە، نوسخەیەکی لای شێخ موحەممەدی خاڵ هەبوو لەگەڵ دەسنووسـەکانی کتێبخانەکەیدا بەخشیی بە کتێبخانەی ئەوقـافی سولەیمـانی • مـەلا موحەممەدی ئیبنولحاجی جێشانەیی یش مودەووەنەیەکی لەسەر هەمـوو توحفە هەیە ، نوسخەیەکیم دیوە لە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ نووسرابووەوە

بیستوومه پیاوێکی نەخوێندەوار بووە خزمەتی حاجی مەلا ئەحمەدی کردووە • حاجی مەلا ئەحمەد لە وەختی پرسی شەرعی لێ کردندا ئەوەنده پێیوتووە فلان کتێبم بۆ بێنەو فلانە شوێنی بکەرەوەو کابرایش زۆر ورد بووە، وایلێهاتووە فێربووە کام باسی شەرعی لە کام شوێنی کام کتێبدایە، پاش کۆچی دوایی حاجی مەلا ئەحمەد هەر کاتێ مەلایان لە مالی ئەودا کۆبووبنەوە بۆ کۆلینەوە لە باسێکی شەرعی ، لەو کابرایەیان پرسیوە فلانە باس لە کام کتێبدا هەیە بۆمان بێنەو ئەویش هێناویەو تەماشایانکردووەو مەسەلەکەیان لێکداوەتەوە • ئەم پیاوە نەخوێندەوارە لەناو مەلایاندا بە (مەلای دەیمی) ناووبانگی دەرکردووە •

حاجی مەلا ئەحمەد لە تەصەوفیشدا پایەیەکی بالای بووە • لەسەر دەستی شێخ عوثمان سیراجوددیندا تەمەسسوکی کردووەو سولووکی کردووە • کە لە سولەیمانییەوە گەڕاوەتەوە بۆ نۆدشە ، بەشێکی وەختی لە بیارە بەسەربردووەو لە خزمەتی شێخ عوثمان سیراجوددیندا خەریکی خۆپەروەردەکردن بووە • پاش وەفاتی شێخ عوثمانیش بووە بە موریدی شێخ موحەممەد بەهائوددینو لە دوادواییی ژیانی ئەودا لەبەر بەدڕەوشتیی کۆیخایەکی نۆدشە دلی لەوێ هەلکەنراوەو کۆچی کردووە بۆ سنەو ئەعیانی سنە پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردووەو بنەمالەی موعتەمەد لەسەر مزگەوتێکی خۆیان دایانمەزراندووەو دێیەکیان کە ناوی (عیساوا)یە بۆ

---

لە کتێبخانەی مزگەوتی گەورەی سولەیمانیدا . بیستوومە نوسخەیەکیتریشی هەیە لای حاجی مەلا مارفی خاوێ لە قەرەداغ .

مەلا یەحیای مزووریش حاشیەی تا باسی نوێژی جەماعەت لەسەر توحفە نووسیوە ، نوسخەیەکی لە کتێبخانەی خانەقای بیارەدا هەبوو ، ئەبێ ئیستا لە کتێبخانەی ئەوقافی سولەیمانیدا بێ . لە مەلا عەبدولعەظیمی موجتەهیدیی سنەییشم بیستووە کە مەلا یەحیا مودەووەنەی لەسەر هەموو توحفە هەیە ، بەلام خۆم نەمدیوە .

خۆراكپێدانی فەقێو ژیانی خۆیو ماڵو منداڵی پێ بەخشیوە تا بتوانێ بە ڕەحەتی ئەرکی ئایینیی سەرشانی خۆی جێبەجێ بکا • بەمجۆرە حاجی مەلا ئەحمەد بە قەدرو حورمەتەوە لە سنە ژیاوەو ، وەك بیستوومە لە ١٣٠٢ی هیجرەتدا کۆچی دوایی کردووە •

حاجی مەلا ئەحمەی نۆدشەیی دوو کوڕی بووە • یەکەم عارف کە لە بیارە لەدایكبووە • ئەم کوڕە لە خزمەتی باوکیا خوێندوویە تا ئیجازەی وەرگرتووەو لەپاش کۆچی دوایی باوکی بووە بە جێنشینیو دەرزی وتووەتەوە • کوڕی دووهەم زەینولعابیدین • ئەم کوڕەشی لای مەلاکانی ناوچەکە خوێندوویەتیو سەرەنجام لای مەلا عەبدولقادری بیارە خوێندنی تەواوکردووەو ئیجازەی وەرگرتووە •

حاجی مەلا ئەحمەد دەستی شیعریشی بووەو نازناوی شیعری (فانی) بووە • بەداخەوە من تەنها بەیتێکی چەکامەیەکی کە بۆ شێخ عوثمان سیراجوددینی نووسیوەو ، پارچە شیعرێکیم ، دەسگیر بووە کە لێرەدا بلاویان ئەکەمەوە •

ئەمە تاقە بەیتەکەی چەکامەکە :

قطع راه هفت‌خوان قتل این دیو سفید
از سراج‌الدین طلب (فانی) ، تهمتن همت‌است

ئەمەش پارچە شیعرەکەی :

آن شیرین یار من دارد همی
صد چو شیرین کوهکن دارد همی

کوژپشت‌است این زلیخای فلك
یوسف کنعان وطن دارد همی

ور عرق شد برگ گل عین گلاب
شرم ازان نازك بدن دارد همی

بوستان محض باشد دل‌ستان
سنبل و سرو و چمن دارد همی

ظلمت کفر از دو زلفش برنخاست
دوستی با اهرمن دارد همی

در عبای تن لطائف در سلوك
شیوهء زان پنج تن دارد همی

زنده‌دل هرگز نمیرد (فانیا)
ننگ از قید کفن دارد همی

# یادی سەییدی عەبدولڕەحیمی مەشهوور بە مەولەوی

## ژیـــانی مەولەوی

سەیید عەبدولڕەحیمی نازناو (مەعدوومی)و بەناووبانگ بە (مەولەوی)، کوڕی مەلا سەعیدی تاوەگۆزیو لە نەوەی مەلا یووسفجانی کوڕی مەلا ئەبووبەکری چۆڕییە کە بە (موصەنیف) مەشهوور بووەو ، ڕشتەی پشتیان ئەچێتەوە سەر خواناسی ناودار سەیید موحەممەد زاهیدی کوڕی سەیید مەحموودی مەدەنی کە بە (پیر خدری شاهۆ) ناسراوەو ، لە نەوەی حەزرەتی حوسەینی کوڕی حەزرەتی عەلیی کوڕی ئەبووطالیبو فاطیمەی زەهرایـــە خوایان لێ ڕازی بێ •

مەولەوی لە سالی ١٢٢١ی هیجرەتدا لە دێی (سەرشاتە)ی ناوچـــەی تاوەگۆزی کە ئەکەوێتە بەری باشووری ڕووباری سیروان ، لەدایكبووە • هێشتا منداڵ بووە مالی باوکی ناوچەی تاوەگۆزییان بەجێهێشتووەو لـــە دێی (بێژاوە) جێگیر بوونو ، لەوێ لای باوکی قورئـــانی پیرۆزو کتێبـــە وردەکانی خوێندووەو فێری نووسین بووە •

پاشان بەپێی دابو نەریتی فەقێی وڵاتی کوردستان ڕۆیشتـــووە بـــۆ هەڵەبجەو لەوێ دەستیکردووە بە خوێندن • هەروەها لە مەدرەسەکـــانـــی دەوروپشتی هەڵەبجـــە وەك خەرپـــانیو خورمـــاڵو بیـــارەو تەوێـــڵەیش خوێندوویەتیو پاش ئەوە چووە بۆ پاوەو ماوەیەکیش لەوێ خوێندوویەتیو پاش ئەوە ڕۆیشتووە بۆ چۆڕ لە مەریوان کە مەڵبەندی کۆنی خۆیان بووەو ،

پاش ماوەیەکیش خوێندن لەوێ ، چووە بۆ شاری سنەو لەوێ لە مزگەوتی وەزیر دامەزراوە • ئەو سەردەمە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەمانوڵلاخـانی گەورە بووە کە یەکێ بووە لە پیاوە بەناووبانگەکانی ئەردەڵانو مزگەوتـی دارولئیحسان ئەو دروستیکردووە • پاش ماوەیەکـیتریش لـە سـنەوە ڕۆیشتووە بۆ بانەو لەوێیشەوە پاشتر هاتووە بۆ سولەیمانیو لە سەردەمی ژیانی شێخ مەعرووفی نۆدیدا بە فەقێیەتی لە مزگەوتی گەورە دامەزراوە •

پاش ماوەیەك مانەوە لە سولەیمانی ، لەوێیشەوە چووەتەوە بۆ هەڵەبجەو لە مەدرەسەی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی لە مزگەوتی جامیعە دامەزراوەو لای مەلا صادقی تەوێڵەیی خوێندوویەتی • ئەم مەلا صادقەیش یەکـێ بووە لـە موستەعیدەکانی شێخ عەبدوڵلا خۆی •

بیستوومە لەم سەردەمەدا باوکی مەولەوی کۆچی دواییـی کردووەو مەولەوی ماوەیەك پەکی خوێنـدنی کەوتووەو خەریکی بەخێوکردنی بـراو خوشکەکانی بووە • پاشان دەستی کردووەتەوە بە خوێندنو چـووە بـۆ قەڵای جوانڕۆ بـۆ لای مـەلا موحەممـەدی قازیو ماوەیـەك لەوێیش خوێندوویەتی ، جا بۆ جاری دووهەم چووەتـەوە بو سـنەو لە مزگەوتـی دارولئیحسان دامەزراوە • لەم چەرخەدا شێخ موحەممەد سەعیدی باوکـی شێخ عەبدولقادری موهاجیر مودەڕڕیسی دارولئیحسان بووە • مەولـەوی ئەمجارە زیاتر لە جاری پێشوو لە سنە ماوەتەوەو پاشان دیسانەوە هاتـووە بۆ سولەیمانیو لە خزمەتی مەلا عەبدولڕەحمانی نۆدشەییدا کە مودەڕڕیسی مەدرەسەی مەلکەندی بووە ، خوێندوویـەتیو لای ئەو تەواویکردووەو ئیجازەی مەلایەتیشی لای ئەو وەرگرتووە •

بیستوومە پاش ئیجازە وەرگرتنی مەولەوی ، بەپێـی دابو نەریتـی پاشاکانی بابان کە هەر فەقێیەك لە سولەیمانی ئیجازەی وەرگرتایە یەکێ لە

پاشازادەکان فەقێ ئیجازەوەرگرتووەکەو کۆمەڵێ مەلاو فەقێی شارو کۆمەڵێ دەستەو دائیرەی خۆی لەگەڵ خۆی هەڵئەگرت‌و ئەچوون بۆ سەیران بـۆ سەرچنار ، ئەحمەد پاشای بابانیش کە میانەی دۆستایەتیی لەگەڵ مەولـەوی زۆر بووە ، مەولەوی‌و کۆمەڵێ مەلاو فەقێ لەگەڵ خۆی ئەبا بۆ سەیران. لە ڕێگەدا فەلاحێك سەری ڕێیان لێ ئەگرێ‌و دەست‌ئەکا بە سکاڵای حاڵـی خۆی لای ئەحمەد پاشاو ئەڵێ پارچە بەراوێکم هەیە هەموو ساڵێ ئەیکەم بە تەڕەکاڵ‌و پێی ئەژیم ، ئەمساڵ یەکێ لە پیاوەکانی تۆ لێی داگـیر کردووم‌و زۆریشم لێ ئەکا بە جووتی خۆم بیکێڵم‌و بیکەم بە تەڕەکاڵ بۆ ماڵی پاشا . مەولەوی دێتە پێشەوە خۆی لە کابرای فەلاح تووڕە ئەکاو ناهێڵێ ئەحمەد پاشا وەڵامی بداتەوە . کابرای فەلاح سەرسام ئەبێ‌و بە مەولەوی ئـەڵێ : مەلا ! تۆ لای خۆت مەلاو پیاوی ئایینی ، کە تکایەکم لای پاشا بۆ نـاکەی، بۆ وا لێم تووڕە ئەبی ؟ مەولەوی‌یش پێی‌ئەڵێ : کابرا ! مردووت مرێ .. من لەبەر بێ‌عەقلیی تۆ تووڕە بووم لێت . ئاخر تۆ نەتبیستووە دنیا کێڵگەی قیامەتە ؟ جا ئەگەر پاشا ئێستا بە جووتی بێگاری زەویی داگیرکراو نەکێڵی‌و نەیکا بە تەڕەکاڵ بۆ ماڵی خۆی ، دنیای چۆن بۆ ئەبێ بە کێڵگەی قیامەت ؟ ئەحمەد پاشا کە ئەم قسەیەی مەولەوی ئەبیسێ ، شـەرم ئەیـگرێ‌و بـە مەولەوی ئەڵێ تکا ئەکەم ئیتر بەس ! کابرا تۆیـش بڕۆ زەویی خۆت بـۆ خۆت‌و هەرکەس هات بەنزیکتا لێت داگیر بکاو زۆرت لێ بکا ، گوێـی مەدەرێ‌و لە کەس مەترسە .

مەولەوی پاش ئیجازەوەرگرتنی ئەڕوا لە دێی چروستانە کە دێ‌یەکە لە نزیکی هەڵەبجەوە ، ئەبێ بە مەلاو مزگەوتێکی تیا ئەکاتەوەو چەند فەقێ‌یەك ڕائەگرێ‌و دەست‌ئەکا بە دەرزپێ‌وتنیان . شوێنەکەی زۆر پێ خۆش ئەبێ تەنانەت باغێکیشی تیا دائەنێ . بەڵام پاش ماوەیەك ئەگوێزێتەوە بۆ دێـی گونە [گوندە] لە ناوچەی تەورۆڵی لە نزیکی چروستـانەوە . لـەوێ‌یش

مزگەوتێك دروستئەكاو فەقێ ڕائەگرێو حوجرەیـان بۆ ئەكاتـەوەو بـە پێخوێندنی ئەوانو ئامۆژگاریكردنی موسوڵمانـانەوە چەند سـاڵێكیش لەوی ڕائەبوێرێ •

پاشان لەوێشەوە ئەگوێزێتەوە بۆ كانیكەوە لە نـاوچەی شەمێران كە نیشتمانی هۆزی (یەزدانبەخشی)یە • لەو سەردەمەدا سەرپەرشتیكردنی ئەو ناوچەیە بە دەست شێخ عەلیی عەبابەیلێییەوە بووە كە زۆر دۆستی مەولەوی بووەو خاتری گرتووەو خزمەتی كردووە • پاشان موحەممەد پاشای جـاف ناوچەكەی لەسەر خۆی تاپۆ كردووەو بەڕێوەبـردنی لـە شـێخ عـەلی سەندووەتەوەو داویەتە دەستی عوسمانی خاڵە كە پیاوموناسبی یەزدانبەخشی بووە • پاش ئەمە مەولـەوی كانیكەوە بەجێئەهێـڵێو ئەگەڕێتـەوە بـۆ سەرشاتەی زێدو نیشتمانی كۆنی خۆی •

كە موحەممەد پاشای جاف لەمە ئاگادار ئەبێ نامەیەكی گلەیی ئامێز بۆ مەولەوی ئەنووسێ • مەولەویش لە وەڵامدا نامەیەكی بۆ ئەنووسێو بۆی باسئەكا كە لەپاش دەرچوونی شـێخ عەلییـەوە لە شەمـیران ، وەزعـی عەشرەتەكەی وەك ئەوسا نەماوەو بۆیە ناچار بووە لەبەر ئەوان بار بـكاو ، ئەم چەند بەیتەشی بۆ ئەنووسێ :

وزان سوی وطن هجرت نمودم
خلافت از علی دانسته بودم

به تاثیر محمد پیر اكمل
خلافت چون به عثمان شد محول

دل خویشان مارا پر ز خون كرد
به خویشاوند خود نعمت فزون كرد

ئیتر لەگەڵ ئەوەشا کە ناوچەی تاوەگۆزی زۆر کوورِو دێم بـووەو ژیانی تیا گران بووە ، مەولەوی هەر لەوێ ماوەتەوەو نەجـوولاوەو بـە هەرجۆر بووە ژیانی بەسەربردووە ، تا لە ۱۳۰۰ی هیجرەتدا کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی مەشهوور بە گۆڕستانی ئەسحابە لە دێی (سەرشاتە) لەسەر بەرزاییەك بە خاك سپێرراوە • مەلا حامیدی کاتبی شێخ عوثمـان سیراجوددین ئەم چەند شیعرەی لە لاواندنەوەیا داناوە :

آسمان گر خون ببارد بر وفات مولوی
زیبد ار برگ سیه پوشند اهل دنیوی

مجمع علم و عبادت مخزن صدق و صفا
مظهر عقل و درایت میر ملك معنوی

پیرو شرع محمد شیخ اولاد حسین
سالك راه طریقت در طریق اخروی

فارس نظم و قصاید در حقیقت ، در مجاز
ریزەچین خوان جودش صد امیر دهلوی

بهر تاریخ وفاتش آنقدر کردیم فکر
کاسمان ( غش ) کرد بر مرگ جناب مولوی

مەولەوی لە دواساڵەکانی ژیانیا کوێربووەو حەوت ساڵی بە کوێری بەسەربردووەو لە ژیانی خۆیا کەپرەکەی ئـاگری تێچـووەو کتێبـەکانی سووتاون‌و خۆیشی لە پارچە شیعرێکیا ئیشارەت بۆ ئەو ڕووداوە ئەکا کە چۆن شیعرەکانی تیا سووتاوە • لەمەوە دەرئەکەوێ کە ئـەبێ مەولـەوی شیعری زۆری فەوتابێ • ڕاستەکەشی قەوارەی بچووکی دیوانەکەی نـە لەگەڵ ژیانی درێژی پڕ لە خۆشی‌و لە دەردو مەینەتی‌و نە لەگەڵ دەستی باڵای لە شیعردا ڕێك‌ناکەوێ •

# ئەو کتێبانەی مەولەوی دایناون

ئەم ذاتە لەبەرئەوە کە شوێنێکی موئاسبی نەبــوە تیا بحەسـێتەوەو ڕێگایەکی شلك‌نەبردووە گوزەران‌و ژیانی خۆی بــە ڕێکوپێـــکی لێــوە دابین‌بکاو زۆر وەختی ژیانی لە گواستنەوەدا بووە لە شوێنێـــکەوە بــۆ شوێنێکی‌تر ، ئەبوو هیچ نووسراوێکی لەپــاش بەجێ‌نەمایە ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ کتێبی بەنرخی نووسیوە هەموویان مــاون‌و ، دیوانێـــکی شیعریشی لەپاش بەجێ‌ماوە کە نوسخەی زۆری لێ نووسراوەتــەوەو بــە گەلێ ناوچەی کوردستانا بڵاوبووەتەوە • ئەم دیوانە شیعرەی یەکەمجــار لــە ســاڵی ١٩٣٥دا بە دوو بەرگ لەگەڵ وەرگێڕانیا بە شیعر بۆ دیالێکتی کرمانجیی خواروو لەلایەن پیرەمێردەوە بڵاوکراوەتەوەو ، جاری دووهەمیش لە ١٩٦١دا بە لێکدانەوەوە لەلایەن منەوە لەچاپ‌دراوە [1] •

کتێبە دانراوەکانی مەولەوی ، جگە لە دیوانەکەی ئەمانەن : یەکەم ــ کتێبێـکی کوردی بە شیعر لەبارەی عەقیدەو بیرو باوەڕی ئیسلامەوە • ئــەم کتێبە هێشتا چاپ‌نەکراوە • من خۆم نوسخەیەکیم لایە [2] •

---

(١) لەپاش ئەو چاپەی دیوانی مەولەوی‌یەوە تائێستا گەلێ نوسخەی‌ترمــان دەسگیر بووە کە بەراوردکردنیان لەگەڵ نوسخە چاپەکە پێویستە . بۆیە بەدەستمانەوەیە ، خوا ڕێکی‌بخا ، لە هەلێکا چاپێکی‌تری دیوانی مەولەوی بکەینەوە ئەنجامی بەراوردی ئەو نوسخە تــازە دەست‌کەوتووانــەشی تیابێ . نیازمان‌وایە لەم چاپە تازەیەدا لە داوێنی شیعرەکانەوە تەنها مەعنا گشتی‌یەکەیان بنووسینەوەو مەعنای وشەکان هەڵگرین‌و لەجیاتیی ئەوە لە داوێندا فەرهەنگێکی تێکڕایی بەپێی تیپەکانی ئەلفوبێ بۆ بــکەین . هەروا ئەشمانەوێ پارچە شیعرەکان بەگوێرەی بابەتیان ڕێك‌بخەین .

(٢) من خۆم لە ساڵی ١٣٣٩ی هیجرەتدا ئەم کتێبــەم لای مامۆسـتــا مەلا ئەحمەدی پاش‌بەردیی مەشهوور بە مەلا ئەحمەدی ڕەش خوێندووە . لە ڕێگای ئەم کتێبەوە پێوەندی ڕۆحیم لەگەڵ مەولەوی پەیداکردو عاشــقی شێوەی شیعرو نووسینی بووم .

دووهەم ــ کتێبێکی‌تری کوردی بە شیعر بە ناوی (العقیدة المرضیة)وە لەبارەی عەقیدەی فیرقەی ئەشعەری‌یەوە کە لە دوو هــەزار بەیــت زۆرترەو لەوپەڕی جوانی‌و ڕەوانیدایە • ئەم کتێبە زۆر بەسوودەو مەولەوی خــۆی حاشیەی زۆری لێ کردووەو هەروا حاجی شێخ ئەحمەدی کوڕی شــێخ عوثمان سیراجوددینیش گەلێ حاشیەی لێ کردووە • وادیارە بە دەرزیش لای مەولەوی خۆی خوێندوویە کاتێ کە مەولەوی لــە تەوێــڵە بووە لای شێخی باوکی سولووکی کردووە • نوسخەی تەواوی ئەم کتێبە لای حــاجی مەلا خالیدی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای موفتیی سنەو لای حاجی مەلا سەعیدی ساداوایی هەیــە •

سێهەم ــ کتێبێکی بە فارسی بە شیعر لەبارەی عەقیدەو بیروبــاوەڕی موسوڵمانانەوە کە ناوی (الفوائح)ە واتە شتە بۆن‌خۆشەکان یا بۆنی خۆش گەیێنەکان • ئەم کتێبەش لە هەزار بەیت زیاترە •

ئەم دوو کتێبە پێکەوە لە ساڵی ١٣٥٢ی هیجرەتدا لە میسر لەلایــەن خوالێ‌خۆش‌بــوو (محی‌الدیــن صــبری النعیــمی الکانی‌مشــکانی)یەوە لەچاپ‌دراون • لەم ساڵانەی دواییشدا لە ڕووی ئەو چــاپەوە بە ئۆفسێت لەچاپ‌دراونەتەوە •

چوارەم ــ نامیلکەیەکی لەبارەی ئیسپات‌کردنی دروستیی (رابطە)وە کە یەکێکە لە ئادابی تەریقەتی نەقشبەندی • ئەم نامیلــکەیە بە فارسی‌یــە ، نوسخەیەکی لای شێخ حەیدەری کوڕی شێخ جەعفەر هەیە کە لە دێیەکی نزیك لە سەیید صادقی شارەزوورەوە دائەنیشێ • ئەم نامیلــکەیە تائێستا لەچاپ‌نەدراوە •

پێنجەم ــ کتێبێکی شیعری ڕەجەزە بە عەرەبــی ناوی (الفضیلة)یــە ٢٠٣١ شیعرە لەبارەی زانستی ئوسوولی دینەوە • ئەم کتێبە کتێبێکی زۆر

بایەخدارە ، مەولەوی بە فەرمانی شێخ موحەممەد بەهائوددین داینـاوەو لە سەردەمی ژیـانی خۆیـدا زۆر خوێنراوە • منیش لە سـایەی خواوە لە سالانی ١٣٧٦ ــ ١٣٧٧دا شەرحێکی باشم بەپێی توانای خۆم لێ کردووە بە ناوی (الوسیلة فـی شرح الفضیـلة)و لـە سـالی ١٣٩٢ی هیـجرەت (١٩٧٢ی•ز)دا لەچاپم‌داوەو ٨١٩ لاپەڕەیەو بە گەلێ ولاتی موسولمانـانو زۆر لای کوردستانا بلاوبووەتەوە • نوسخەیەکی نایابی ئەم (الفضیلة)یـەم لایە بە خەتێکی زۆر جوان نووسراوەتەوە ، حاشیەی زۆری مەولەوی خۆیو مەلا فەتاحی پاوەییو خەتی مەولەوی خۆیشی پێوەیە •

لە خوالێخۆش‌بوو سەییـد عەبدولڕەحمـانی عازەبـانیم بیستـووە ئەیفەرموو : لە بیارە لە خزمەتی شێخ نەجموددینـدا کتێبێـکم دی نـاوی ( خاطراتی مەولەوی ) بوو گەلێ شتی بەسوودی لەبـارەی مەولـەوی‌یەوە تیابوو • ئەبێ ئەم کتێبە فەوتابێ وا شوێنەواری لە هیچ‌لایەکەوە دیارنی‌یە •

هەروا بیستوومە حاجی سەیید عەلیی مەلای (لۆن) دیوانێکی مەولەویی لایە موناسەبەتی دانانی پارچە شیعرەکانی تیا نووسراوەو لە ڕووی نوسخەی مەلا ئەسعەدی پایگەلان نووسیویەتەوە •

ئاخ ، مەولەوی ! خۆزگە بەو سۆزو عەشقو تێکۆشینە لە ولاتێکدا ئەبووی هەرچیت ئەنووسی وەرئەگیراو لەچاپ‌ئەدرا ، تا جیهانی کوردستان بەلکو هەموو جیهانی موسولمانان بە تەئلیفاتو ئاسارو ئەشعارت ڕووناك ببوایەتەوەو ، تا هەموو دنیا بیزانیایە بێشەی کوردستان چجۆرە شێرێـکی تێدا بووەو ، مزگەوتە بێ‌ئەوقافو بێ‌نازەکانی زانای گەورەو بەرزو پیاوانی خاوەن بەهرەی ئەدەبیی چۆنیان پێ‌گەیاندووە • لە شاعیرانا کەسـانی وەك مەولەویو مەلاخدری نالیو عەبدولڕەحمان بەگی سـالمو مستەفـا بەگی کوردیو مەلا موحەممەدی مەحویو شێخ ڕەزای تالەبانیو مەلا مستەفـای بێسارانیو صەیدیی هەورامیو وەلی دێوانەو موحەممەد ئـاغای دەربەنـد

فەقەرەو خانای قوبادی‌و مەلکەی مرادوەیس‌و حاجی قادری کۆیی‌و مـەلا عومەری ڕەنجووری‌و ، لە زانایاندا کەسانی وەك ئیبنولسەلاحی شارەزووری‌و کەمالوددینی ئەربیلی‌و ئیبنولحاجیبی سندی‌و سەیفوددینی ئامودی‌و فاضیل موحەممەد ئەفەندیی گۆرانی‌و ئیبنو خەلەکان‌و مەلا عەبدوللای بیتووشی‌و کەسانی‌تریش پەروەردەی سووچی ئەم مزگەوتانە بوون •

هەربژی ناوی نامیی مەولەوی
لە ڕیزی سەعدی‌و جامی‌و دیهلەوی

بژین زانایان لە ڕووی جیهانا
لە زانای عیلمی ماددی‌و مەعنەوی

حەشرمان بکا خودا بە کەرەم
لەژێر سای ئالآی بەرزی نەبەوی

## سەفەری مەولەوی بۆ ئەم‌لاو ئەولا

مەولەوی زیاد لە وردە سەفەرەکانی بـۆ دیـدەنی‌کردنی دۆستـان‌و برادەرانی لە تاوەگۆزی‌و جوانڕۆو زەهاوو ، بۆ ناو عەشایری قوبـادی‌و باوەجانی‌و وەڵەدبەگی‌و جاف‌و شەرەف‌بەیانی‌و ، بـۆ شـارەزوورو ، بـۆ هەورامان بۆ زیارەتی شێخ سیراجوددین‌و بەهائوددین‌و ، بۆ سولەیمانی بۆ زیارەتی کاك ئەحمەدی شێخ‌و بۆ سنە بۆ خزمـەتی شـێخ عەبدولقـادری موهاجیر کە لەوێ مامۆستای بووە ، چەند سەفەری تایبەتیی تریشی بـووە کە ڕۆژگار پێویستی‌کردوون لەسەری • وا کورتەیەك باسی هەندێ لـەو سەفەرانەی ئەنووسینەوە بۆ ئاگاداری‌و بۆ یادگار •

یەکێ لەو سەفەرانەی سەفەرێکیەتی بۆ سنە کە بە فەرمانی شێخ عوثمان سیراجوددین بووە لە ١٢٧١ی هیجرەتـدا لە خزمـەتی مـەلا ئەحمـەدی

تۆدشەیی‌و شێخ عەبدولڕەحمان ئەبولوەفای کوڕی شێخدا بۆ لای ئەمانوڵلا خانی والیی کوڕی خوسرەوخانی ئەردەڵان کە لەقەبی (غولاّمشا خان) بووە٠

ئەم سەفەرە لەسەر داواو پێشنیهادی مەلایان‌و پیاوماقووڵانی سنە بووە لای شێخ سیراجوددین کە یەکێ لە کوڕەکانی لەگەڵ کۆمەڵێ لە مەلا گەورەکانا بنێرێ بۆ لای غولاّمشا خان ئامۆژگاریی بکەن بەڵکو لە بیروباوەڕی شیعەیەتی پەشیمان بێتەوەو بێتەوە سەر ئایینی خەڵکی کوردستان‌و ، ئەگەر هەر وازیش ناهێنێ ، هیچ نەبێ واز لەوە بهێنێ کە حاجی کەریم خانی موجتەهیدی هەمەدانی بێنێ بۆ سنەو بە زۆر بەسەر خەڵکەکەیدا بسەپێنێ تا شیعەیەتی لەناویانا بلاّوبکاتەوە ٠

شێخیش ، شێخ عەبدولڕەحمان ئەبولوەفای کوڕی‌و حاجی مەلا ئەحمەدی تۆدشەیی‌و مەولەوی بۆ ئەم مەسەلەیە ئەنێرێ بۆ سنە ٠ خەڵکی سنە پێشوازی‌یەکی گەرم لەم میوانانە ئەکەن ٠ ئەمانیش چەند ڕۆژ لە سنە ئەمێننەوەو لەم چەند ڕۆژەدا چەند جار چاویان بە غولاّمشا خان ئەکەوێ‌و گەلێ گفتوگۆی لەگەڵ ئەکەن ، بەلاّم هەمووی بێ‌سوود ئەبێ‌و غولاّمشا خان لەسەر حاڵی خۆی ئەمێنێتەوەو ، ئەمانیش ناچار بە دڵگرانی‌یەوە ئەگەڕێنەوە بۆ هەورامان [٣] ٠

سەفەرێکی‌تری مەولەوی بۆ سابلاّخ بووە کە ئێستە بە (مەهاباد) بەناووبانگە ٠ مەولەوی لە ڕێی مەریوانەوە چووە بۆ ئەم سەفەرەو لە ڕێ لای زانای گەورە سەیید حەسەنی چۆڕی لای‌داوە ، کە ئەویش بە پشت ئەچێتەوە سەر مەلا ئەبووبەکری موصەننیفی باپیرە گەورەی مەولەوی ٠

---

(٣) لە ئەنجامی ئەم مەسەلەیەدا هەرایەکی گەورە لە سنە قەوماوە کە بە (واقیعاتی کاروانسەرا) بەناووبانگەو چەندکەسی تیا کوژراوە . لە باسی (دۆستانی مەولەوی)دا ئەگەڕێینەوە بۆ ئەم مەسەلەیە .

بیستوومە مەولەوی لەم سەفەرەدا فەرەنجی‌یەکی درێژی لەبەردابووە لەوانەی لەناو قوبادی‌و باوەجانیدا لەبەریان‌ئەکەن • لە مەلا ئەورەحمانی چۆڕیم بیستووە کە ژن‌برای سەیید حەسەن بوو ئەیوت مەولەوی لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕێبوارو ماندوو بوو ، شەوان پاش ئەوە کە میواندارەکانی بەجێیان‌ئەهێشت کەمێك ئەنووست ، ئیتر پاشان هەڵئەسایەوە بۆ شەونوێژو دوای ئەوە ڕووەو قیبلە دائەنیشت خەریکی ذیکرو فیکری خواو بەجێ‌هێنانی ئادابی تەریقەت ئەبوو و بەوجۆرە ڕۆژی ئەکردەوە •

مەولەوی کە ئەگاتە سابڵاخ مەلاکانی ئەوێ پێشوازی‌یەکی گەرمی لێ ئەکەن ، بەڵام تاقمی ماڵی سەیید نیظامی لەگەڵ ئەوەیش کە چۆڕی‌و خزمی مەولەوی بوون گوێی‌نادەنێ ، تا سەرەنجام بەهۆی یەکتری دیتن‌و گوێ‌گرتن لە موناقەشاتی عیلمیی مەولەوی‌یەوە لە پایەو ڕێ‌و شوێنی ئەگەن‌و بانگی ئەکەن بۆ ماڵی خۆیان‌و قەدرو حورمەتی ئەگرن •

سەفەرێکی‌تری مەولەوی بۆ کەرکووك بووە لە سەردەمی ژیانی شێخ عەبدولڕەحمانی خالصیی تاڵەبانیدا • مەولەوی ئەم سەفەرەی لە زەمانی شێخ عوثمان سیراجوددیندا کردووە • شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی لەم سەفەرەی مەولەویدا زۆری حورمەت گرتووە • بیستوومە مەولەوی بە شەو گەیشتووەتە کەرکووك‌و یەکسەر چووە بۆ لای شێخ عەبدولڕەحمان‌و ، دیویە هەرچەند خەڵك هەموو نووستوون ئەو بەخەبەرەو خەریکی عیبادەتە ، ئەم بەیتەی بەسەرا ئەخوێنێتەوە :

شەوەن ، خەڵوەتەن ، ماڵ بێ‌ئەغیارەن
ئاڵەم گرد وتەن ، دۆس خەبەردارەن

ئەویش بەم بەیتە وەڵامی ئەداتەوە :

نیازم ناڵەن بەی کەڵپۆسەوە
شەو ناڵین وەشەن وە لای دۆسەوە

مەولەوی لەم سەفەرەدا ماوەیەك لە تەکیە ئەمێنێتەوە ، جا ئەگەڕێتەوە •

سەفەرێکی تریشی هەروا بۆ کەرکووك بووە ، بەڵام پاش کۆچی دوایی شێخ سیراجوددین و شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی و ، لە سەردەمی شێخ بەهائوددین و شێخ عەلیی تاڵەبانیدا • برادەرێك لە زمانی سەیید موحەممەدی کوڕەزای مەولەوی یەوە بۆی گێڕاومەتەوە کەوا ئەم چوونەی مەولەوی بۆ کەرکووك جۆرە تۆرانێك بووە لەبەر دڵعاجزی ، هەرچەند نەیئەزانی هۆی ئەم دڵعاجزی یەی چی بووە •

مەولەوی لەم سەفەرەیدا چەند مانگێك لە کەرکووك ئەمێنێتەوە ، پاشان بە فەرمانی شێخ بەهائوددین ، شێخ ضیائوددینی برای لەگەڵ چەند سوارێك ئەچن بۆ لای بۆ کەرکووك بەڵکو ئاشتی بکەنەوەو بیهێننەوە ، بەڵام مەولەوی بەگوێیان ناکا • پاش ئەوەی ئەوان سوار ئەبن و ئەکەونە ڕێ بگەڕێنەوە بە دوو سێ سەعاتێك ، مەولەوی ئەکەوێتە حاڵێکی ناتەبیعیی وەك جەزبەوە • شێخ عەلی بەوە ئەزانێ پێی ئەڵێ : مەولەوی ! وائەزانم ئارەزووت لێیە بگەڕێیتەوە ؟ چەند سوارێك ئەخاتە تەکی ، لەگەڵی ئەڕۆن تا ئەگەنەوە بە شێخ ضیائوددیندا ، مەولەوی لەگەڵ ئەوان ئەگەڕێتەوەو سوارەکانیش ئەگەڕێنەوە دواوە بۆ کەرکووك •

هەروا بیستوومە لە زمانی سەیید موحەممەدەوە گێڕاویانەتەوە مەولەوی ئەو پارچە شیعرەی کە بەم بەیتە دەس پێ ئەکا :

وەخیلافەوەن ، یاران سەرمەس
تەقازای زاتیی تەبعم هەرچی هەس

بەهۆی ئەو تەبیعەت تێکچوونەیەوە وتوویەتی کە ئەوەبووە قسەی شێخ بەهائوددینی شکاندووەو شێخ ضیائوددینی هەروا گێڕاوەتەوە ، پاشان ئەو حاڵەتە دەروونی یە توندەی بەسەرا هاتووەو ئەو پارچە شیعرەی

وتووەو ، لەگەڵ پیاوەکانی شێخ عەلیدا کەوتووەتەڕێ تا گەیشتووەتـەوە بە شێخ ضیائوددین‌و لەگەڵی گەڕاوەتەوە بۆ هەورامان [٤] •

سەفەرێکی‌تری مەولەوی بە نیازی حەج بووە • لەم سەفەرەیدا تـا بەغدا دێ • پاش چەند ڕۆژ مانەوە لە بەغدا هاوڕێـکەی ڕێی کە لەگەڵی هاتووە لەڕێدا خزمەتی بکاو هەرچی پارەی مەسرەفی ڕێیان بووە لای ئەو بووە ، هەڵدێ‌و پارەکەیش ئەدزێ‌و لەگەڵ خۆی ئەیباو ئەگەڕێتەوە بـۆ تاوەگۆزی‌و لەناو هۆزدا بلاوی ئەکاتەوە کەوا مەولەوی لە بەغدا مردووەو کوڕەکانی پرسەی بۆ دائەنێن •

مەولەوی‌یش کە بێ‌کەس‌و بـێ‌مەسرەف ئەمێنێتـەوە ، ناچارئەبـێ بگەڕێتەوە بۆ ماڵ • کە ئەگاتە بەرموە ئەبینێ هاوڕێکەی لەوێ‌یەو خـزم‌و عەشرەت هەموو بەهۆی هەواڵی درۆی مردنی ئەوەوە کە ئـەو کابـرا پێی گەیاندبوون ، پەرێشانن ، بەلام ئەم لەجیاتیی ئەوەی لۆمەو سەرزەنشتی کابرا بکا پێی‌ئەڵێ بەخوا قەسەم بمزانی‌یـایە هاتووینەوە بۆ ئێرە ، تا تۆ لەم ولاتەدا بوایەی پێم تێ نەئەنا بۆئەوەی شەرمەزار ئەبی [٥] •

وتمان مەولەوی زۆر جار بۆ زیارەتی کاك ئەحمەدی شێـخ‌و شێـخ عەبدولقادری موهاجیری مامۆستای چووە بۆ سولەیمانی • لـە یـەکێ لەم

---

(٤) لە دیوانی مەولەویدا وتوومانە مەولەوی ئەم پارچە شیعرەی لە وەلامی نامەیەکی شێخ سیراجوددیندا وتووە . ئەگەر ئەمەی بە زمانی سـەیید موحەممەدی کوڕەزای مەولەوی‌یەوە گێڕراوەتەوە ، ڕاست بێ ، ئەبێ ئەوەی ئەوێ هەڵە بێ . بەلام تێکڕا بە پارچە شیعرەکەدا دیارە کە نامەیەك لە مەیدانایەو مادەم ئەمەی سەیید موحەممەد گێڕاویەتەوە ڕاست بێ، ئەبێ نامەکە هیی شێخ بەهائوددین بووبێ‌و بە شێخ ضیائوددیندا بۆی ناردبێ.

(٥) ئەبێ ئەم کابرا کابرایەکی بێگانە لە هۆزو عەشرەتی مەولەوی بووبـێ ، چونکە پیاوی عەشرەت ڕووی نایە کاری‌وا ناپیاوانە بـکاو بشگەڕێتەوە نـاو عەشرەت .

سەفەرانەیدا کاك ئەحمەد پێی ئەڵێ مەولەوی ئامۆژگاری‌یەکم بکە • مەولەوی‌یش وەڵامی ناداتەوە • کاك ئەحمەد قسەکەی لێ دووبارە ئەکاتەوە • مەولەوی هەر وەڵامی ناداتەوە • کاك ئەحمەد بۆ جاری سێهەمیش داوای لێ ئەکاتەوە ، ئەمجارە مەولەوی ئەڵێ : لە جاری یەکەمدا کە پێت وتم ،تەماشام کرد هیچ واجب‌و سوننەتێك نی‌یە تۆ تەرکت کردبێ‌و من عەرزت بکەم بیکە • لە جاری دووهەمیشدا تەماشام کرد هیچ حەرام‌و مەکرووهێك نی‌یە کردبێتنت ، تا پێت بڵێم تەرکیان بکە • ئێستا هەر ئەوەندەت عەرزئەکەم شەیتان خۆی مڵاس‌داوە بۆت ، ئاگات لە خۆت بێ تەفرەت نەداو لە خۆتت بایی‌نەکا • جا کاك ئەحمەد گەلێ فرمێسك بەچاویا دێتە خوار •

خوالێ‌خۆش‌بوو سەیید ئەحمەدی عازەبانی بۆی گێڕامەوە وتی : سەیید حەسەنی موفتی داوای حەبیبە خانی کچی شێخ عەلیی عەبابەیلێ ئەکاو ئەیدەنێ • جا کە لە سولەیمانی‌یەوە ئەڕۆن بۆ عەبابەیلێ بەشوێن بووکدا ، شێخ عەلیی باوکی بووك بە مەولەوی ئەڵێ مەولەوی من کەسم نی‌یە لەگەڵ حەبیبە بینێرم بۆ سولەیمانی‌و لە تۆ مەحرەم‌تر نی‌یە بە ماڵی ئێمە ، لەگەڵی بڕۆ ، ئەویش لەگەڵ بووك ئەڕوا •

لە ڕێگادا بە عادەتی برازاوا دەست‌ئەکەن بە گۆرانی‌وتن • یەکێ لەو کۆمەڵە کە ناوی (حەمەی ئامین) بووە ، دەنگی زۆر خۆش بووە • دەس‌ئەکا بە (قەتار)و (ئای ئای) وتن بە شیعری مەولەوی‌یەوە • مەولەوی بەسواریی وڵاخەوە لەبەر خۆشیی دەنگی حەمەی ئامین جەزبە ئەیگرێ‌و بەجۆرێ لە حاڵی تەبیعی دەرئەچێ ئەکەوێتە خوارەوە • خەڵکەکە دائەبەزن‌و ڕاستی ئەکەنەوەو سواری وڵاخەکەی ئەکەنەوەو لە حەمەی ئامینیش توورە ئەبن ئەڵێن خەتای تۆ بوو وا مەولەوی کەوتە خوارەوە • حەمەی ئامێنیش دێ بەلای مەولەوی‌یەوە پێی‌ئەڵێ قوربان بۆچی وات پی‌هات ، خۆ من هەر

شیعرەکانی خۆتم ئەخوێندەوە ؟ ئەویش ئەڵێ کوڕە کەی شیعری من ئەوەندە خۆش و بەتەئسیرە ؟ بەخوا خەتای ئاوازەکەی تۆ بوو ٠

## پێوەندی ڕۆحیی مەولەوی

سەرەتای پێوەندی ڕۆحیی مەولەوی ، وەك مەنسووبێکی تەریقەتی نەقشبەندی ، بە شێخ عوثمان سیراجوددینەوە بووە ٠ پاش کۆچی دوایی ئەو بووە بە مەنسووبی شێخ موحەممەد بەهائوددینی کوڕی و زۆری باوەڕ پێ بووە و بە (ئایینەی کامڵ) واتە ئاوێنەی تەواو و پێگەیشتوو ناوی بردووە ، واتە هەموو سیفەتە بەرزەکانی باوکی ڕەنگیان لەمیشا داوەتەوە ٠

مەولەوی بە نامەی بەرز و شیعری پڕسۆز هەستی پاك و خاوێنی خۆی بەرابەر بەم دوو ذاتە هەمیشە دەربڕیوە ٠ لێرەدا بۆنموونە ئەو پارچە شیعرەی ئەنووسینەوە کە بەبۆنەی هاتنەوەی شێخ بەهائوددینەوە لە سەفەری حەج دایناوە و بۆی ناردووە :

ئاینەی کامڵ ! ئازیزەکەی فەرد !
فیدای ئامات بم صەفاییت ئاوەرد !

خەیلێن گەرد پات نە دیدەم دوور بی
یانەی چەم وێران تەمام خاپوور بی

خاس بی تەشریفت هەم ئاوەردەوە
گەرد پات وەتەن ئاواکەردەوە

ساقی ، ئینە بەزم وەصڵ یارانەن
چەرخیچ هەر ئەو چەرخ هەردە جارانەن

دەورێ دەر وە بەزم وە پیاڵەوە
ژەنگ دڵ وە زاخ مەی بماڵەوە

جامێمان جە دەس تۆ هەم سەندەبۆ
فرسەتەن نصیو نەك نەمەندەبۆ (٦)

## چەردەیەك لەبارەی ژیانی کۆمەڵایەتیی مەولەوی‌یەوە

لەگەڵ ئەوەشدا کە مەولەوی لەبارەی ئابووری‌یەوە هەرگیز ژیانێکی خۆشی ڕانەبواردووە ، هەرگیز ئامادە نەبوە لەپێناوی ژیانی دنیادا دەس لە عیزەتی نەفسی خۆی هەلگرێ . لە نامەکانی مەولەویدا کــە دەسگــیرمان بوونو هەروەها لەو دەنگوباسانەیەوە کە دەمبەدەم ئەگێڕرێنەوە ، بۆمــان دەرئەکەوێ کە زۆرجاریش فەرمانڕەوایانی ناوخۆی ناوچەکە بــەوجۆرەی کە شایانی کەسێکی وەك مەولەوی بێ لەگەڵی نەجوولاونەتەوەو قەدریــان نەزانیوە . کەچی فەرمانڕەوایانی قاجاری‌و ئەردەلانی گەلێجــار بانگیــان کردووەتە لای خۆیانو دێهاتو مولکیان داوەتێ ، بەڵام ئــەو قوبوولــی نەکردووەو هەرگیز نەیویستوە خزمو کەس‌وکارەکانی‌و ناوچــەی کرێنــی تاوەگۆزی بەجێ‌بیلێ‌و بە مولکی دنیای ئەگۆڕیونەتەوە . بۆنموونە فەرهاد میرزای مامی ناصرودین شا داوای لێ کردووە بڕوا بۆ ئێرانو هەر مولکێ دڵی ئەیگرێ هەڵی‌بژێرێ بۆ خۆی . غولامشا خانی ئەردەلانیش داوای لێ کردووە بچێ بۆ ناوچەی سنەو دێی (زەلان) وەربگرێ بۆ خــۆی ، بــەڵام

---

(٦) لە دیوانی مەولەویدا نووسیومە کەوا مەولەوی ئەم پــارچە شیعرەی لە پێشوازی لێ‌کردنی شێخ بەهائوددینیدا وتووە کە چووە بۆ سەرلێ‌دانی ، بەڵام پاشان بۆم دەرکەوت ئەوە هەڵەیەو بەبۆنەی هاتنەوەی شێخەوە لە سەفەری حەج دایناوە .

مەولەوی هەر ئەوەی پێ باش بووە هەرچۆن بووە لە (سەرشاتە) کڕینەکەی خۆی بمێنێتەوە •

مەولەوی تا ساڵی ١٢٩٣ی هیجری ، واتە تا دە ساڵ پاش کۆچی دوایی شێخ سیراجوددین ، بێدەردو مەینەت ڕاپبواردووە ، بەڵام لەو ساڵەوە ئیتر کەوتووەتە بەر تیری گەردوون • مردنی عەنبەر خاتوونی ژنیو ، پاش ئەوە کوێربوونی خۆیو ، ئەنجا سووتانی ماڵەکەی کــە کتێبخانەکەشــی تیــا سووتاوەو ، پاشتر کۆچی دوایی شێخی بەهائوددینو ئەو کەلێنە ڕۆحییــە گەورەیەی بەو ڕووداوە کەوتووەتە ژیــانیو، پــاش ئەوانــەش لــە وڵاخ کەوتنەخوارو پشت شکانی ، هەموو ئەمانە دواساڵــەکانی ژیانیــان لــێ تاڵکردووەو ئیتر تا سەری یەکجاریی ناوەتەوە بەدەم دەردو ئــازاری دڵو دەروونەوە تلاوەتەوە •

## خێزانو منــاڵی مەولەوی

ئەوەی لە پاشماوەی بنەماڵەی مەولەویمان بیستووە ئەوەیە کە مەولەوی تاقە ژنێکی هێناوەو ئەو ژنەیش (عەنبەر خاتوون)ی خوشکی (ئەکرەم) ناوی ئەفغانی بووە کە یەکێ بووە لە چەند ئەفغانی لە وڵاتی خۆیانەوە کۆچیــان کردووە بۆ کوردستانی بابانو لە پەنای پاشای بابانا خۆیان گرتووەتــەوە • لەناو ئەمانەدا ئەکرەم زۆر دیارو سەربەدەرەوەبوو بووە •

مەولەوی عومرێکی باشو خۆشو پڕخۆشەویستیی لەگــەڵ عەنبــەر خاتوون بەسەربردووە • ئەمەش بەوەدا دەرئەکەوێ کە بە مردنــی عەنبــەر خاتوون دنیا لە پێشچاوی مەولەویدا تاریك بووەو ، گەلێ پارچــە شیعری ناسکی پڕسۆزی لە لاواندنەوەیا وتووە کە بەرزترین نموونــەی شیعــری خۆشەویستیو لاواندنەوەن لە ئەدەبی کوردیدا •

مەولەوی لە عەنبەر خاتوون چەند کوڕو کچی بووە • کوڕەکانی ئەمانەن : (١) سەیید موحەممەد کە گەورە بووەو ژنی هێناوە ، بەڵام لە ژیانی مەولەوی خۆیدا بە گەنجی مردووەو لە دێی (گوندە) بە خاك سپێرراوە • ئەگێڕنەوە لە کاتی نەخۆشیی مردنی ئەم کوڕەی مەولەویدا باوکی لە تەوێڵە بووە لای شێخ سیراجوددین • ئەنێرن بەدوایا بگەڕێتەوە • کە دێتەوە لەپشت دێی (عەنەب)ەوە دەس ئەکا بە گریان • لێیئەپرسن بۆچی ئەگری ؟ ئەویش ئەڵێ چۆن نەگریم ! حەزرەتی یەعقووب بۆنی کراسەکەی یۆسفی کوڕی بە لووتا هات پێی شادمان بوو، من بۆنی کفنی موحەممەدی کوڕم دێتە لووتو دڵم ئەبرژێ ! کە ئەگاتەوە ماڵ ئەبینێ موحەممەدی کوڕی مردووەو شۆرراوەو پێچراوە لە کفنەکەی و چاوەڕوانی گەڕانەوەی باوکینی • ئەم سەیید موحەممەدە تاقە کوڕێکی بووە کە ناوی موحەممەد سەعید بووەو وەچەی لێ کەوتووەتەوە •

(٢) شێخ موحەممەد کە ئەمیش گەورە بووەو ژنی هێناوە ، بەڵام بە گەنجی مردووەو کوڕێکی لێ بەجێماوە کە ناوی عەلی بووە • ئەمیش هەروا وەچەی لێ کەوتووەتەوە •

(٣) سەیید عەبدوڵڵا کە زۆر ژیاوەو چەند ژنی هێناوەو گەلێ وەچەی لێ کەوتووەتەوە •

(٤) هیدایت کە بە گەنجی بەر لە ژنهێنان مردووە• بیستوومە شێخ بەهائوددین بەبۆنەی مردنی ئەم کوڕەوە چووە بۆ دڵدانەوەی مەولەوی و سەرخۆشی لێ کردنی • مەولەوی بەمهاتنەی شێخ ئەوەندە شادمان بووە وتوویە خۆزگە چەند کوڕم ئەبوو یەك لەپاش یەك ئەمردن بەمەرجێ تۆ بۆ پرسەی هەرکامیان بەمجۆرە ئەهاتی بۆ لام •

نەوەی مەولەوی هەموو ئینسانی ڕەوشتبەرزو بەشەرەف بوونو

تێکەڵی‌یان لەگەڵ بنەماڵەی شێخ سیراجوددین بووەو هاتوچۆی شێخ ضیائوددینیشیان کردووە ، تەنانەت ئەوەندە لەگەڵ ماڵی شێخ تێکەڵ‌بوون هەرچەند هاتوونەتە بیارە ئەوەندە خۆیی بوون‌و ئەوەندە ماونەتەوە ، زۆر کەسی نەشارەزا وایان‌زانیوە کوڕانی شێخن لە دەرەوە هاتوونەتەوە بۆ ماڵی باوکیان • ئەمانە زۆر بە قەناعەت‌و بوردەباری لە دێهاتی عەشرەتی خۆیانا ، وەك (مۆرتکە)و (زارێن)و (سەرشاتە) ڕایانبواردووە ، لەگەڵ ئەوەش هەمیشە میوانیان بووەو خەڵك لایان‌داوەتە لایان‌و ماڵیان وەك کاروانسەرا بووە بۆ ڕێبوارانی ئەو ناوچەیە •

## دۆستانی مەولەوی

کەسێکی ئەدیب‌و نوکتەزان‌و سۆفی‌و مەلای گەورەی وەك مەولەوی ، لە ماوەی هەشتا ساڵی ژیانیا بەتەبیعەتی حاڵ ئەبێ دۆست‌و برادەرێکی زۆری بووبێ • ئێمە لێرەدا باسی هەندێ لە بەناووبانگەکانی ئەوانە ئەنووسینەوە •

یەکێ لەو دۆستانەی مەولەوی ئەحمەد پاشای (٧) کوڕی سولەیمان

---

(٧) ئەحمەد پاشا خۆیشی لە عولوومی دینی‌دا پایەبەرز بووە • من خۆم نوسخەیەك کتێبی کەماڵی شەرحی شافیەم لەلایەن مامۆستام شێخ عومەری ئیبنولقەرەداغی‌یەوە دەسگیر بوو لە ئاخریەوە نووسرابوو بە دەستی ئەحمەدی کوڕی سولەیمانی بابان نووسراوەتەوەو ساڵی نووسینەوەکەی بە هیجری‌و میلادی‌و عیبری‌و قیبطی دیاری کردبوو • بەداخەوە پاشان ئەو کتێبەم لە دەست دەرچوو •

لە سەردەمی تەدریس کردنیشما لە نێرگسەجار لە ١٣٤٤ی هیجرەتدا لاپەڕەی یەکەمی کتێبێکی تەفسیری بەیضاویم لەناو کتێبەکانی کتێبخانەی مەدرەسەی نێرگسەجاردا دی بە خەتی ئەحمەد پاشای بابان لێی نووسرابوو ئەم تەفسیری بەیضاوی‌یەم وەقف‌کرد لە سەیید عەبدولڕەحیمی مەولەوی • دیارە کتێبەکە پاش مردنی مەولەوی کەوتووەتە ئەوێ‌و بە دەستی فەقێ‌وە دڕاوەو هەر ئەو پەڕەیەی ماوە •

پاشای بابانە کە هەر لە سەردەمی فەقێیەتیی مەولەوی‌یەوە دۆستــی بووەو پێشتریش باسێکم گێڕایەوە کە پاش ئیجازە وەرگرتنی مەولەوی سەیرانێکی بۆ ڕێکخستووە بۆ سەرچنار •

یەکێکی‌تر لە دۆستانی مەولەوی موحەممەد پاشای جاف بــووە کــە سەرۆکی هەموو خێڵی جاف بووە • پاشان خوا یار بێ ئەو نامە بێ‌نوختەیــە ئەنووسینەوە کە مەولەوی بۆی نووسیوە •

یەکێکی‌تر لە دۆستانی مەولەوی مەحموود پاشای جافو یەکێکی‌تریان عوثمان پاشای برای مەحموود پاشا بووە •

دۆستێکی‌تری مەحموود بەگی خزمی مەحموود پاشا بووە کــە زۆر دۆستی بووەو بە شیعرو پەخشان نامە لەبەینیانا هاتووەو چووە • یەکێ لەو نامانە ئەم پارچە شیعرەیە کە ئەم مەحموود بەگە بۆ مەولەویی ناردووە :

شمالا عمر افزائی و جان بخش
کە هستی چون دم عیسی روان بخش

سیه ابر از تو چون سیماب گردد
ز فرت کوه برفین آب گردد

که دارم عرضه‌ای ای دل‌نوازم
تحمل کن که بنده عرض سازم

مهمی هست مارا از شمیران
ز روی لطف آنجا اسپ میران

مترس آنجا اگرچه جای بیم‌است
مقام مرشدم مولی (رحیم)است

ز آشوب زمان و چرخ غدار
ز شومی (عمر پاشای سردار)

یزید ثانی آن سردار افخم
ولایت شد ز بیدادش پر از غم

(اذلّه)را نموده اهل عزت
که مولای من از او کرده هجرت

(چرستانه) بزد آتش به یك‌بار
گزیده جای خود دامان کهسار

میان (قلعه)و دشت (ولوبر)
سیا چادر زده چادر به چادر

ورا (عثمان خاله) و (کاکه یونس)
ندیمان یمین هستند و مونس

یسارش‌را (خضر بگ) با (فتاح)است
به همراهیش آنها ذوجناح‌است

شرفیاب حضورش باش از من
تو از من دست آویزش به دامن

ز حال بنده میپرسد که چون‌است
بگو دیدم که در گرداب خون‌است

که از خیل مهین بانوی أرمن
لرستان‌را قدیمه کرده موطن

ز قصر از بیم شیرویه گریزان
به (مخمل‌کو) شدند افتان‌و خیزان

یکی مه‌پاره‌ء از نسل شیرین
بت شکر شکن بازوی رنگـین

رخش ماه دو هفته کرده محبوس
لقب شیرین ثانی نام طاووس

پی تفریح قلب و خواهش دل
سرای میر مارا کرده منزل

نه بتواند قلم وصفش نوشتن
به خود دارد همی بیم شکستن

مه دو هفته در وی دید ناگاه
مقابل چون نشد با روی آن ماه

اشارت کرد تار هردو گیسو
مه دو هفته‌را آرند بر رو

خبرداراست البت سرور ما
ز حبس ماه و حکم دلبر ما

خرامان رفت روزی سوی صحرا
شود سر سبز ازو گلهای حمرا

ز ( شیروان تپه ) تا دامان ( شاکل )
گروه آهوان بد گلّه در گل

نظر افتادشان بر چشم جادو
سراسر چشم آهو گشت آهو

غزالان جمله صف صف ایستادند
اطاعت‌را همه گردن نهادند

من مهجور طاقت رفته از دست
ربوده جان و دل آن نرگس مست

گریزان گشته عقل و هوش هر سو
معلق روح مانده دست زانو

ولی او از بدن کرده کناره
بفرما ، سرورا ، تا چیست چاره ؟!

بۆ ڕۆشن‌کردنەوەی مەبەست لەم پارچە شیعرە ئەڵێین کەوا مەولەوی ، وەك پێشتریش باسمان‌کرد ، پاش ئیجازە وەرگرتنی هاتووە لە دێی چروستانەی نزیك هەڵەبجە دانیشتووەو ماڵی موحەممەد پاشای جاف‌و خزمانیشی لە هەڵەبجەو دەوروپشتی هەڵەبجە بوون‌و گەلێ‌جار هاتوون بۆ دیدەنیی مەولەوی‌و مەولەوی‌یش سەری لەوان داوە • لەو سەردەمەدا دەوڵەتی عوسمانی ئەیەوێ چەك لە موحەممەد پاشاو خێڵەکەی وەربگرێ‌و بێ‌چەکیان بکا ، بەم‌نیازە (عومەر پاشای سەردار) بە سوپاوە ئەنێرێتە سەریان • ئەوانیش ناچار ئەبێ شارەزوور بەجێ‌دێڵن‌و ئەگوێزنەوە بۆ ئەو چیایانەی بنار • مەولەوی‌یش کە ماڵی لە چروستانە ئەبێ بارئەکا ئەچێ بۆ پشتی کانی‌کەوەی شەمێران‌و لە شوێنێکدا کە ناوی (وڵبەر)ە نیشتەجێ ئەبێ • عومەر پاشایش گەلێ لە دێهاتی شارەزوور ئەسووتێنێ کە هیی دەستەو دائیرەی موحەممەد پاشا ئەبن‌و چروستانەیش یەکێ ئەبێ لەو دێهاتانە • ئەم کارەساتە لە ١٢٧٦ی هیجرەتدا ڕووی‌داوە • عومەر پاشا کە سەرناکەوێ بە مەرامی خۆی بگاو عەشایری جاف چەك‌داماڵراو بکاو موحەممەد پاشا بگرێ ، ئەگەڕێتەوە بۆ مووسڵ • بەگزادەو خەڵکی کۆچ‌کردوویش ئەگەڕێنەوە بۆ ئەم‌بەری سیروان‌و لەم‌کاتەدا موحەممەد پاشایش زەماوەند بۆ مەحمود پاشای کوڕی ئەکاو ژنێکی دەنگ‌خۆشی (تاوس) ناو لەو زەماوەندەدا

گۆرانی ئەڵێ • ئەو سەردەمە هێشتا ماڵی مەولەوی هەر لەوبەرەوە بووەو هێشتا نەگەڕاوەتەوە بۆ چروستانە خانوو لەوێ بۆ خۆی دروستبکاتـەوەو لەگەڵ موحەممەد پاشای دۆستی بەیەكبگەنەوە •

مەحموود بەگ ئەم پارچە شیعرەی لەمبارەوە بۆ مەولەوی نووسیوەو لە سەرەتایەوە باسی ئاژاوەی عومەر پاشای سەردارو سووتاندنی چروستانەو بارکردنی مەولەوی لەگەڵ خەڵکی دەوروبەردا بۆ شەمێرانو دەوارهەڵدانیان لە (وڵبەر) ئەکا • پاشانیش دێتە سەر باسی زەماوەندەکەو گۆرانیوتـنی تاوسو جوانیی ئەم تاوس ناوە • دیارە مەولەوییش وەڵامی ئەم نامەیـەی داوەتەوەو ئەبێ بە پارچە شیعرێکی جوانی ـ دوور نیـیـە پڕ لە هەسـتی نەتەوەییو داکۆکیکردن لە وڵات ـ یش وەڵامی دابێتەوە ، بەڵام سەد داخ ئێمە تائێستا ئەم وەڵامەیمان دەسگیر نەبووەو ئاگادار نین ئەبێ لەکوێو لای کێ بێ !

دوایتر لە دۆستانی مەولەوی ڕەزاقولی خانو غولامشا خانی کوڕانی خوسرەو خانی کوڕی ئەمانوڵلا خانی ئەردەڵانن [٨] •

(٨) ڕەزاقولی خانو غولامشا خان ئەدیبو بنووس بوون ، بەتایبەتی غولامشا خانیان ئەدیبو شاعیرێکی بەرز بووەو شیعری بە دیالێکتی گۆران وتووەو لێرەدا چەند پارچە شیعری بڵاوئەکەینەوە :

(١)

میرزام زام حەی .. میرزام زام حەی ..
دانایان دەور ، دانش کەردە تەی ..
ئەفلاتوون فامان ، حەکیمان حەی
پەی ئازار دڵ نیشاندان دوو بەی
هۆرێزام دەردەم شاران کەردم تەی
ناگا دیم دوو بەی نە سەر شاخەی نەی
بەی چ بەی ؟ ئەمەر نەونەمام نەی
خۆلاسەو خۆشبۆ ، خۆش مەزە چۆن مەی

نه فەوق بەیدا جفتێ سیا حەی
موستەحفیظ مدران نه دەوران بەی

تەواسیامەوە ، مەخفی بیم جه حەی
تەرسام ، نەبەردم دەس پەی بنەی بەی

مەر هەم بای شەماڵ بیاوۆ پەی پەی
جه هەم جیا کا حەیو بەیو نەی

وەرنه ئەی طیفله طیفلئاسای خودرەی
پەنجه مپێکۆ نه قولابەی بەی

حەیو بەیو نەی جەرگم کەردەن پەی
زیندەگیم پەی چی ؟ وەی وه یانەم وەی !

قەومانو خوێشان کێ دیەن ، کێ ، کەی ؟
بەی میوەی نەی بۆ ، حەی نه دەور بەی ؟

گیسوو چون عەقرەب پێچ پێچەن چون حەی
لوولەن چون لاولاو پای نەمام نەی

به حوکم قادر عەلا کوللی شەی
وه بەیان بەیان مەقسەد کەردم تەی

(غولام) بەشق ئەو شا لامەکان کەرد تەی
بێدەرس ، عولووم حاسڵ بیەش پەی

وەس بشۆ نه فیکر ئینتیظار بەی
سەودای بەی ڕەنگت زەرد کەرۆ چون خۆی

( ٢ )

ڕاس دڵ مەیژه (والی) ئەر شا بێ
واجبه بۆ دز پا له حاشا بێ

بەڵ ئەمه خوداس حەپس تەقدیر بی
دەس وه دوو شاخەی زوڵف زنجیر بی

حوسن بێپایان زوڵف پەرێشـــان
زنجیرەکەی دڵ ، تازیانەکەی گیان

زوڵفو کاکۆڵی دوو دەرد تەوئەم
ئەم عوقدەی موشکوڵ ، ئەو بەند مەحکەم

شێت بە بەو زنجیر ، بەو دەشتو دەرا!
ئەمجار نۆبەتــە بدەی وەسەردا

سەرتاپام قوربان پا تا سەرت بێ
دەوڵەتەکەی حوسن هەر تا سەرت بێ

لەو بادە بدە ســاقیی بێمیثال
ذەوقێ وەك هیجران ، شەوقێ وەك ویصال

فاریغ کا لە قەید ســوودو زیانــم
نە ســوودو زیان حەتتا نەزانم

مەستم یا هوشیار ، بێدارم یا خەو
یارم یا ئەغیار ، من منم یا ئەو

ئەرزانی بێ میسر بە عەزیزەکەی
خەلاص بیم نە دەس تۆرە حیزەکەی

یارەب بە یەعقووب یۆسف وە سەبرێ
حەقم بسێنی ، حەقۆسێن نەمرێ

بە یەکێ وەك خۆی دەسەویەخەی کا
نیمە شەو دوچار چفە چفەی کا

وەك چاوئێشەدار ئێش‌و گلی بێ
ئەمجارە نۆبەی تلاوتلی بێ

بە دەرد عیشقۆ دەوا دەوا کا
بدا وەسەردا ، خودا خودا کا

( ٣ )

ماددە موستەعید وەقت نەشتەرە
وەلێکین خۆفێ سەختم لەبەرە

سەراپام مەملوو لە مەیل لەیلە
وجوودم نە جام حەیات کەیلە

فەساد بێخەبەر نە کەین‌و بەینێ
ئێش نێش وە مەیل لەیلێ نەگەینێ

لەووەختە نەفەس کەوتە شومارە
دیدە وە حەسرەت نیگای دووبارە

ناڵەی بولبولێ بۆ لائوبالی
(والی) نە بولبول خاستر دەنالی
وەللاهی صیدقە ئەوقاتت تاڵە
مصیبەت زەدەی ، حاڵت بەدحاڵە
لەو زەخمە دەرهات وە بن گوێچکیدا
دەرچوو ، خاس دەرچوو ، وەلای دۆچکیدا
ئەگەر وەك جاران ئەیتلێنێتەو
قەدرێ وەئەدەب ئەیکولێنێتەو
لەبەر ئێش‌و نێش خدێم زاری‌یە
زەخم (ئەورام)ان خەیلێ کاری‌یە
لەو حاڵەتەیشدا فەرامۆش نەبووی
ئافەرین (والی) بازی‌گۆش نەبووی
ثابیت قەدەم بووی ، دڵ دڵە نەبووی
سیرِ نیکادێر بووی ، دەم‌هەڵە نەبووی
موونیس‌و ئەنیس شەو تارم بووی
گاە گوڵ ، گاە بولبوڵ ، گاهی خارم بووی (★)

ئەم غولام‌شا خانەو ڕەزاقولی خانی برای چەند جار بەهۆی ناحەزی‌کردنیانەوە لەگەڵ یەکترو پەنابردن بە حوکمڕانانی تاران ، لە حوکمڕانیی ئەردەڵان لابراون‌و لەسەری دانراونەوە . سەرەنجام حوکمڕانی بۆ غولام‌شا خان جێگیر بووەو لەسەری ماوەتەوە تا کۆچی دوایی کردووە. هەندێکیش ئەڵێن دەرمان‌خوارد کراوە . ئەڵێن ئەم ذاتە بووە بە جەعفەری‌و گەلێ‌جار لەسەر هەندێ شت هەراو ئاژاوە لە وڵاتەکەیا پەیدابووە . جارێکیان مەولەوی پشت بە دۆستایەتیی کۆن نامەیەکی بۆ نووسیوە لەبارەی هەندێ شتەوە ئامۆژگاریی تیا کردووە . ئەو نامەیەم بەداخەوە نەدیوە ، بەڵام وەڵامەکەی غولام‌شا خانم دەسگیر بووە ، ئەوا لێرەدا ئەینووسمەوە :

(★) ئەم سێ پارچە شیعرەم لە ڕووی کەشکۆڵەکەی خوالێ‌خۆش‌بوو مەحموود پاشای جاف نووسیوەتەوە ، لەوێ تەنها لە پارچەی یەکەمیان نووسرابوو هیی (غولام‌شا خان)ە ، لەو دوانەکەیان نووسرابوو هیی (والی)ن ، بەڵام وا مەشهوورە (والی) نازناوی شیعریی غولام‌شا خانە .

« نازم به خرابات که اهلش اهل‌است
چون نیك نظر کنی بدش هم سهل‌است
یك اهل دل از مدرسه نامد بیرون
ویران شود این مدرسه دارالجهل‌است

نامهء نامی و خطاب مستطاب گرامی سامی بتمامی ، من البدء الی الختم اولا و لفظا ، و من الختم الی البدء ثانیا و معنی ، بنظری از شائبهء دوربینی محفوظ ، و خاطری از رسیدن نصف المواصلة محفوظ ، ملحوظ گردید .

غمت‌را در دلم کرد آشکارا زخم پیکانت
فغان در پرده نگذارد یکی راز نهانی‌را

فدای التفاتهای نهانی و عیانیت‌را شوم . مطلب طریقتی و بلکه پارهء از نکات شریعتی‌را بحکم حدیث «استر مذهبك» مستور و دائما غیر مسطور داشته‌ام . ولی دراین مقام که موقع بیشتر از پیشتر خفا واخفااست ، اگر عرض نکنم روحانیان دور نیست ارباب هوای نفس و غرضم شمارند (و لا حول و لا قوة الا بالله) .

در اوائل عمر عزیز که بهار نوشانوش و بریز بریز بود ، با عدم سلوك و غلبهء نهایت شکوك و استطاعهء حالی و مالی ابناء ولاة و ملوك متذکر شدم (ما للعب خلقنا) . حتی المقدور ، از نزدیك و دور ظاهرا احکام شرع مقدس‌را تابع ، و نفس اماره بسوءرا بمفاد (لایسقط المیسور بالمعسور) از مناهی و ملاهی مانع گشتیم . بعد از چندی و گرفتاری بکنده و کمندی خستگی دلبستگی بهم رسید متذکر گردیدیم که اولوالالباب‌را حضرت دوست محض این قشر و پوست نساخته‌است. اگرچه هرچه از دوست میرسد نکواست بخیال وصال افتادم ، و دیده دل براه دیدن آن جمال‌را گشادم ، من جانب الله اخذ طریقهء علیهء نعمت‌اللهی‌را از سالك مسالك‌و منجی هر مهالك مرحوم کلاب‌علی شاه که منسوب بشاه علی‌رضا شاهندی بود نمود و مدتها طریق این طریقت علیه‌را پیمود .

و در ثانی در دارالخلافهء تهران در خدمت مستان معرفت جناب مستان شاه هندی تکمیل بقدر استعداد شد . وبعد در خدمت مرشد هندی رحمه الله اخذ طریقهء علیه قادریه کرده بود ، و در خدمت سراسر سعادت مرحوم مولانا ملا عبدالله تهمتانی طائی طاب‌ثراه اخذ

طريقهء عليهء نقشبنديه کرد ، و مدتى در خدمت کعبهء ايشان و مرحوم ملا احمد کولهساره رحمه الله تعالى بسربرد تا الى يومنا هذا که محض فضل حضرت رحيم بشرف صحبت ناشرالدين والأمان جناب شيخ عبدالرحمن سلمه الله تجديد عهد نمود ، و بلسان قلب استدعاى گشودن باب رحمت کرد . اميداست از ذکر (يا من هو بمن ترجاه کريم) حسن خاتمه نصيب گردد .

چه کار داشتى که نگذاشتى دردم
نهان و خلق در حقم بى‌گمان باشند

بعد ازين تفصيلات زحمت ميدهد آن جناب در املاکات من مختارند هرجا ميل داشته باشند سکونت نمايند ، بخصوص در قريهء (زلان) ملك من مادام حيات من و شما ، آن شمااست ، وبعد از من تو از بازماندگان من خوشحال صريح ميباشيد ، و اخلاف شما اهل شما باشند حسبما قرر و حرر آنها برقرار دارند . من که طاقت وداع ندارم خدا حافظ . (ان الذى فرض عليك القرآن لرادك الى معاد . وصلى الله على محمد وآله الطاهرين اجمعين) » .

له ڕستەکانی دواییی ئەم وەڵامەی غوڵامشا خانەوە وا دەرئەکەوێ مەولەوی لە سەفەرێکی سنەیدا ، پێش گەڕانەوەی بۆ کوردستانی عوسمانی نامەکەی بۆ نووسیوەو ئەویش وەڵامی داوەتەوە ، بۆیە داوای لێ ئەکا لە دێی (زەلان)ی موڵکی ئەودا دانیشێ‌و ، ئەبێ پێشانیش لەمڕووەوە قسەی لەگەڵ کردبێ‌و ، هەروا ئەبێ مەولەوی ماڵاواییی لێ کردبێ ، بۆیە ئەویش ئایەتی (ان الذى فرض عليك القرآن لرادك الى معاد)ی بۆ نووسیوە .

ئەم غوڵامشا خانەو ڕەزاقولی خانی برای کوڕی خوسرەو خانی ناکامن‌و دایکیان ناوی (حوسنی جیهان‌خان)و کچی فەتحعەلی شای قاجار بووەو بەهۆی دایکیانەوە بارو دۆخی ناو خانەدانیان گۆڕاوەو لە سوننی‌یەتی‌یەوە بوون بە جەعفەری‌و بەتایبەتی یەکەمیان بەتەواوی بووە بە جەعفەری ، بەڵام دووهەمیان ئەڵێن لەسەر ڕێ‌و شوێنی سوننی‌یەتی ماوەتەوە .

خوسرەوخانی باوکیان کوڕی ئەمانوڵڵا خانی گەورەیە کە مزگەوتی دارولئیحسانی سنەی دروستکردووە . باوکیان وەك دایکی ئەمان ژنی بووە ، مێردی (مەستوورە)ی شاعیری بەناووبانگیشە کە دیوانی لەچاپدراوی هەیە . بنەماڵەی ئەمانە مەشهوورە بە (ئەردەڵانی)و ئەڵێن

باپیرە گەورەیان ناوی (ئاردڵ) بووە واتە (ئاگردڵ) واتە چوستو چالاكو ئازاو پاڵەوان .

ئەم بنەماڵەیە لە سەرەتای موسوڵمانبوونی كوردستانەوە سەریان هەڵداوەو لە دەرباری وەزیرەكانی (بەنیموهەللەب)و (ئەبوموسلیمی خوراسانی)دا بوونو پاش ماوەیەك بوون بە سەرۆكو فەرمانبەدەستو میرنشینییان بۆ خۆیان پێكەوەناوە . لە سەردەمی موغوولییەكاندا (قوباد) ناوی ئەردەڵانی كە هاوچەرخی (پەشمووت)ی كوری هولاكو بووە، دەسەڵاتبەدەست بووەو خۆی لەگەڵ موغوولەكانا سازاندووە . ئەم بنەماڵەیە سەدەها ساڵ حوكمڕانی ناوچەی كوردستانی ناوەڕاست بوون ( كە پاشان بە ناوچەی ئەردەڵانو بابان ناسراوە ) ، هەرچەند گەلێجار ئەم حوكمڕانییەیان كشاوەتەوەو كەمدەرەتان بووەو گەلێجاریش پەرەیسەندووەو زۆر لای گرتووەتەوە . لە سەرەتادا ماوەیەكی زۆر پێتەختیان لە (پالنگان) بووە لە هەورامانی ئەودیو لە داوێنی كێوی شاهۆوە . تا ئەمدواییەش مزگەوتی ئەو دێیە كە ئەڵێن لە سەرەتای هاتنی موسوڵماناندا كراوە بە مزگەوت ، هەر مابوو و كۆڵەكەكانی بەپێوەبوون(*) . ماوەیەكیش پێتەختیان (قەڵای مەریوان) بووە . ماوەیەكیتریش لە (قەڵای زەڵم)ەوە حوكمڕانییان كردووە ، جا گواستوویانەتەوە بۆ دێی (حەسەنئاوا) كە بە ناوی حەسەن خانی ئەردەڵانەوە دروستكراوەو ئەوسا گواستوویانەتەوە . بۆ قەڵای (سینەدژ) كە ئێستا مەشهوورە بە (سنە) .

---

(*) مەشهوورە مەولانای جامی لە سەفەری حیجازیا ڕێیكەوتووەتە ئەو مزگەوتە . لەوكاتەدا مەلایەك دەرزی جامی (الفوائد الضیائیة)ی بە فەقێیەك وتوەتەوە ، شوێنەكە باسی (ئەمری دائیر) بووە ، مەلاكە باش نەیزانیوە جنێوێكی داوە بەوەی كتێبەكەی داناوە كە مەولانای جامییەو لە مەجلیسەكەدا حازر بووە ، بەڵام مەلاكە نەیناسیوە . كە مامۆستاو فەقێ هەڵساونو مەجلیسەكەیان بەجێهێشتووە ، مەولانا حاشیەیەكی لەسەر ئەو شوێنە نووسیوە لە كتێبەكەداو بۆی ڕوونكردوونەتەوە تیایا. دوعایەكی شەڕیشی لە نەوەی ئەو مەلایە كردووە كە هەركامیان كتێبی جامی بخوێنێ تەواوی نەكا . ئێستا بنەماڵەی مەردۆخی جامی ناخوێنن چونكە لە نەوەی ئەو مەلایەنو گوایە ئەترسن دوعاكەی مەولانایان لێ گیرا ببێ .

